# هایکۆ

تریفەی مانگ لەسەر دار کاژ

جاناتان کلیمینتس

وەرگێڕانی بۆ فارسی: نیکی کەریمی

وەرگێڕانی بۆ کوردی: جەبار سابیر

# هایکۆ

تریفەی مانگ لەسەر دار کاژ

بابەت: شیعری ژاپۆنی

وەرگێڕانی بۆ فارسی: نیکی کەریمی
وەرگێڕانی بۆکوردی: جەبار سابیر
تایپ و نەخشەسازی: وەرگێڕ
تیراژ: هەزار دانە
چاپ: یەکەم چاپ پاییزی دوو هەزارو حەفت
چاپخانەی: ئاکام
ژمارەی سپاردنی(944) ساڵی 2007ی وەزارەتی رۆشنبیری دراوەتێ.

jabarsabir@hotmail.com

## دەسپێك

شیعری یا گومانەكانی هایكۆ بەر لەهەر شیب جۆرێكە لەفەلسەفە، ئەم جۆرە شیعرە تایبەتە ژاپۆنییەكانو هیچ نەتەوەو كۆمەڵگەیەكی تر شیعری لەم جۆرەی نییە. رەگەزی سەرەكی شیعری هایكۆ گەڕانەوەیەكی پەتییە بۆ سروشتو ژیان لەناو سروشتدا. ئەمە جگە لەوەی كەنابێت لەسێ كورتە دێڕ تێپەڕێت. زۆرێك لەشارەزایانی ئەدەبی كوردی پێیانوایە كورتە شیعر یاخود پۆستەرە شیعر ئەوەی لەسەرەتای حەفتاكانی سەدەی پێشوودا هاتە ناو شیعری كوردییەوە نزیكییەكی لەگەڵ (هایكۆ) هەیە، بەڵام ئەو بۆچوونە تەواو راستنییە چوون پۆستەرە شیعری ئێمە كەمتر گەڕانەوەی تێدایە بۆ سروشت لەكاتێكدا وەك پێشتر وتمان (هایكۆ) لەسروشتدا لەدایك دەبێتو تامو بۆیەكی فەلسەفیشی پێوە دیارە. باشترین شاعیرانی ئەم جۆرە شیعرە (باشۆ)یە كەزۆرترین شیعریشی هەیەو لەم كتێبەدا دەیخوێننەوە. لێرەدا دەكرێ ئەوە بڵێم كەمن ئەم وەرگێڕانەم وەك عەشقێك بۆ شیعرەكان كردووەو گەر سەركەوتووش نەبوبێتم ئەوە بەگەورەییتان بم بەخشن. چوون شیعر بۆخۆی وەرگێڕانی زۆر سەختەو ئەوەندەی بۆشم كرابێت هەوڵی خۆمداوەو لێرەشدا حورمەتی زۆرم بۆ مامۆستای خۆشەویستم (عەبدولكەریم شێخانی) كەهەمیشە بەڕێنماییەكانی كۆمەكم دەكاتو بەوەرگێڕانەكانمدا دەچێتەوە، بەتایبەتیش لەم بەرهەمەدا زۆرم ماندوكرد، شایانی سوپاسە.

نەلەدەشت و نەلە چیا
جووڵەی زیندەوەرێك نایا
لەم کازیوە بەفرینەدا.
چیو _نی

لەم سپێدە بەفرینەدا.
ناڵەی مەلان
نابیسترێ.
چیو _نی

لەم سپێدە بەفرینەدا
لەئەسپەکان راماوین.
باشۆ

لەنێوان گوڵە نیلۆفەرەکاندا.
ڕۆژووەکەم شکاند
باشۆ

چەندە چێژ بەخشە
بینینی سەوزەگیای تازە
کەسەر دەردێنن.
بونچۆ

لەبەر بارانی بەهارێدا
هەموو شتێك جوان دیتە بەرچاو.
چیو _نی

**گوڵە داودییە سپییەکان**

**لەکازیوەدا باڵا بەرزتر**

**دێنە بەرچاو.**

**یاسن**

**نیلۆفەر ئاسا**

**ژیانم چەند خێرا تێپەڕی**

**ئەمڕۆ...؟**

**موریتاکە**

**ئەی کۆللارە**
**لەگەڵ خۆت بمانبە**
**کاتێ لەبەند ئازاد دەبی.**
**تاما**

**لەپشت پەنجەرەیەکی گچکەوە**
**شەوی بێ پایانی دیدار.**
**باشۆ**

**هاوسێکانم**
**ئەم پاش نیوەڕۆ پاییزییەیان**
**چۆن تێپەڕاند؟ نازانم.**
**باشۆ**

**بەفری تازە_**
**گەڵا زەردەکانی نێرگزیان**
**چەماندەوە.**
**باشۆ**

قەلەڕەش
کەهەمیشە رقم لێیان دەبێتەوە
لەقەراغ بەفری ئەم بەیانییەدان.
باشۆ

ئەی هێلکە شەیتانۆکە
بەلوتکەی فۆجیدا سەرکەوە
هێواش، هێواش.
ئیسا

مەلە ئاوییەکان
زۆر سەنگین دێنە بەرچاو
کەخۆیان لەئاو هەڵدەکێشن.
ئۆنیستورا

وەك گوڵی نیلۆفەر
ژیانی  من
سەراپا وەك رۆژێك دێتە بەرچاو.
مۆریتاکە

سپێدە
بەفر بووە باران
گوناهی نزیك بوونەوەی بەهار .
سامپۆ

ئاونگی بەرەبەیان
بەکەڵکی هیچ نایات.
ئایسا

لەدەوری کۆشکەکە
لەدەنگ مراویان
رۆژدەبێتەوە.
کیورۆکۆ

ئاھ ئەی گوڵی نیلۆفەر
تەنانەت تۆش بەجێت ھیشتم.
باشۆ

هێشتا سەری ساڵ تەواو نەبووە
چاو دەبڕمە شاخی فیجی.
سۆکان

بێ سەفەرو
بێ بەهار،
ئەم سپێدەیەم لەدەست چووبوو.
شیکی

گوڵێك هەڵوەری ـ
پەپولەیەك دەیباتەوە
شوێنی خۆی.
مۆریتاکە

بەبێ پەڕەموچ
شۆڕەبی (با) ڕەنگ دەکات.
ساریۆ

گڵکۆی ساگای ڕووگەش
لەنێو سەوزە گیای زستاندا.
شیکی

لەڕۆشنایی ڕۆژدا
سوور دەچێتـەوە
گەردنی کرمی شەوچرا.
باشۆ

کۆنە گۆمێك
بازدانی بەراز
خوڕڕەی ئاو.
باشۆ

دوا نیوەڕۆیەکی پاییزی
بیر لەدایكو باوکم دەکەمەوە.
بۆسۆن

**دڵم دەگوشرێ**

**لەجوانی شکۆفەکانی گێلاس**

**تاتسۆ ـ جۆ**

**مانگە شەوێك**

**هەرچیم گوتووە**

**(وڕێنە)بوو.**

**تۆکۆگن**

**لەقەراغی تاڤگەکە،**
**هەورەکان هاتن**
**هەورەکان رۆیشتن**
**بەسەر گەڵاکانی دار ئەفرادا.**

**سۆشکی**

**ماسییە سوورە کونجەکان بازبازێن دەکەن**
**هەورەکان لەڕێڕەوی رووبارەکەوە**
**دەڕۆن.**

**تۆنی تسورا**

**روباری هاوینە**
**پردی هەیە**
**بەڵام ئەسپەکان خۆیان بەئاوەکە**
**دەکێشن.**

**شیکی**

**نەبەهارو**

**نەهاوین**

**نەیانتوانی بگەنە هەڵەموتەکانی فۆجی.**

**باشیتسۆ**

**هەورێ لەگوڵ**

**دەنگی زەنگێ.**

**لە ئوئەنو، یائاساکوز.**

**باشۆ**

**لەنەسیمی بەهاردا،**

**پیاوە بەڕێزە گەمییەوانەکە**

**پایپەکەی پێکرد.**

**باشۆ**

**بەڕوباری هاوینەدا تێدەپەڕم**
**بەخۆشی**
**کەوشەکانم لەبن هەنگڵمە.**
بۆسۆن

**گژوگیای هاوینە ـ**
**بەجێماون**
**جەنگاوەرانی ئازا.**
باشۆ

**بولبول ـ**
**لەپشت بییەکانەوە**
**لەپشت بێشەکانەوە.**
باشۆ

**هەموو ئەوەی هاتە سەرزمانم ئەمە بوو**
**ئاه، ئاه**
**گوڵە یۆشینۆکان.**
نیشیتسۆ

**سەگ بەفرۆشیارە**
**گەڕۆکەکان دەوەڕن**
**دار هەڵووژەکان دەپشکوون.**
بۆسۆن

**دارکونکەرە**
**بەشوێن دارێکی وشکدا دەگەڕێ**
**لەنێو گوڵە پشکووتووکانی گێلاسدا.**
یۆسۆ

سەراسیمەیان کردین
گوڵەکانی درەختێك کەنازانین چییە،
بەبۆن و بەرامەیان.
باشۆ

ئاه ئەی پەپولە
ئارەزوت چییە
لەوەختی باڵە فڕێدا.
چیو ـ نی

بودای مەزن
تەنانەت لەخەونیشدا
گوڵ و ئاڵتون دەگرێ.
ئایسا

**زەوییەکانم فرۆشت،**
**بەڵام خەو نەچووە چاوم**
**لەبەر قیڕە قیڕی بۆقان.**
**هۆکۆشی**

**گەڵا سوورەکانی پاییز**
**کەمڕەنگ دێنە پێش چاو**
**لەپاڵ کەروێشکەی مەرەزە.**
**کیکۆ ـ شانی**

**جێگە باڵی پەڕندە**
**لەسەر رووی گەڵای سووری ئەفرا.**
**شیکۆ**

**گەڵاکان،**

**لە(با) بپرسن**

**کامتان یەکەمین گەڵابوون کەوتنە خوار.**

**سۆشۆکی**

**هەموو گریانەکان تەواو بوون**

**دەنگیٚ نییە**

**جگە لە(زیکە)ی زیکزیکە.**

**باشۆ**

**بەدرێژایی شەقام**

**شتێك بەرچاو ناکەوێت**

**لە من بەولاوە،**

**لەم پاشنیوەڕۆی پاییزەدا.**

**باشۆ**

**چاوی هەڵۆیان تاریك دەبن**
**وەختێك گورگ‌و مەڕو**
**پۆڕەكان  دەیكەنە هەرا.**
**باشۆ**

**لەسەر زەنگێكی گەورە**
**پەپولەیەك هەڵدەنیشێ‌و**
**دەنوێ.**
**بۆسۆن**

**ئەمڕۆش دیسان،**
**خۆر بەسەر گوڵە خەرتەلەكانەوە ئاوابوو.**
**تان تان**

سەرخەوێك دەشكێنم و
وا لەڕووباری كوێستانان دەكەم
چەڵتوكم بۆ بكوتن.
ئایسا

پشیلەكە دەخەوێ و بێداردەبێتەوە
بەباوێشكێكی درێژەوە
بۆ مێبازی دەكەوێتەڕێ.
ئایسا

ڕۆژی سەری ساڵ
وەك هەر دوا نیوەڕۆیەكی پاییزی
تەنیام.
باشۆ

**دوای رۆژێکی درێژ**
**بەباوێشك دانەوە**
**لێك جیابووینەوە.**
**سۆشۆکی**

**پاشنیوەڕۆی ئەمڕۆ**
**لەسەر حەوزە کۆنەکە**
**بەفر بەسەر مراوییەکاندا باری.**
**شیکی**

**بێ ئەوەی سپی بن**
**سیس بوونو وەرین**
**گەڵاکانی شۆڕەبی.**
**شۆکیو ـ نی**

**دنیا پڕ ڕەنجەو بەم حاڵەشەوە**

**گێلاسەکان گوڵ دەگرن.**

**ئایسا**

**پیاوێ کەدەڵێ:**

**جگەرگۆشەکەم خۆشناوێ**

**(بێ گومان هیشتا گوڵی نەناسیوە)**

**باشۆ**

**بەم سوورە هەتاوە**

**لەقوڵایی دەریادا**

**لەقەراغی گۆمی موگامی.**

**باشۆ**

هۆ راوچی پوشکەبەقنە
ئەمڕۆ ئەو چەند فڕی بوو؟
چیو- نی

سەرزەوی جیٚ هیٚشت
قازە کیٚوی دەگەڕیٚتەوە.
شۆمپا

هەم کیٚڵگەکەو هەم چیاش
هەردووك تارای بەفریان پۆشی
چیتر شتیٚك نابینریٚ.
یۆشۆ

کاتیٚ تۆ ڕۆیشتی،
ئیتر گوڵ لەسەر زەوی نابینم.
سۆشکی

ڕەشەبای زستان
خۆر دەخاتە
دەریاوە.
سۆشکی

ماندووومردوو
لەگەڕان بەشوێن کوخێك
وەستاوم تاگوڵی لۆبیا ببینم.
باشۆ

**سروەی پاشنیوەڕۆ**
**لۆچ دەخاتە**
**قاچی ماسیگرە.**
بۆسۆن

**کێ دەمرێ؟**
**ئاشکرانییە**
**زیکزیکەی پڕ هاتوهاوار.**
باشۆ

**غروبی رەنگ شینی ئاسمان،**
**داری سەروو تریفەی مانگی کردۆتە تابلۆ.**
رانتسۆ

**پەپولەکان هەرگیز هەڵناکەندرێن**
**بەبای پاییزی**
**جەخار بۆ گوڵە خەرتەلەکان.**
باشۆ

کاتی بارانی بەهارە،
بەڵام شەو
تریفەی مانگ دار کاژەکان کەوتووە.
ریۆتا

وەختی مانگەشەو
لۆکەجاڕ
یەك پارچە گوڵجار دێتە بەرچاو
باشۆ

کۆترە باریکەیەك دەگمێنێ
لەنێو بێشەلانی حەیزەران ـ
من بەدیار مانگەوە هەڵتروشکاوم.
باشۆ

(مانگ)ی پاییز
ڕووناك‌و ورشه‌دار
بۆ هه‌موو ئه‌مانه ده‌نووسم.
شیکی

به‌بینینی گه‌مییه‌ی ڕاوچییانی قاز
خه‌مبارم.
باشۆ

گه‌لێك گوند
گوڵ‌و گیایان نییه‌و ماسییه‌كان ناناسن
به‌ڵام هه‌موویان ئه‌مشه‌و مانگ ده‌بینن.
سای كاكۆ

کرمە درەوشاوەکانی شەو
لەڕەنگدانەوەی روناکی خۆیان دەترسن
لەئاوەکەدا.

سۆتە ـ یۆ

شەوی پاییزان ـ
شادم
بەتەنیایی.

باشۆ

بەڕێدا دەڕۆم،
سێبەرەکەیشم لەتەنیشتم
لەمانگ دەنوارم.

سۆدۆ

کەباران خۆشیکردەوە
دەردو رەنج سارد بوونەتەوە
لەشاخی ئاساما.

سۆدۆ

لەهەمان ئەو ماڵەی جوتیارەکان نووستوون
تریفەی مانگو گوڵیان تێدایە.

باشۆ

ئاسمان ساوە
مانگو بەفر
هەر دووك یەك رەنگن.

سۆگنسۆ ـ نی

دەریا رەش دەچێتەوە،
دەنگی مراوییە کێوییەکان
سپی وماندووە.
باشۆ

جێی ستایشە کەسێك بیر نەکاتەوە،
ژیان تێپەڕیوە.
کاتی سمکۆڵانی رەخش ــ ی رۆستەم.
باشۆ

لە تریفەی مانگە شەودا
تەنانـەت مێشـولەکانیش کەلەتاریکیـدا دێـن و
دەچند  جوان دێنە بەرچاو.
بای شیتسۆ

بێ ماندوو بوون
بە دیار مانگەوە دانیشتووم
نەجارێك‌و نەدووان.

کی جین

ڕێژنە بارانی هاوین
ژنێکی تەنیا
سەیری دەرەوە دەکات.

کی کاکۆ

هەور گەلێك
مانگیان هەڵگرتووە.

بۆنجۆ

کاشکی ئەو لێرە دەبوو
دڵداری تووڕەو تۆسنم ـ
مانگی پڕ.

ئایسا

لەگەڵ کەسێکدا کەبەئاشکرا راوبۆچوونی ناڵی
دوا نیوەڕۆیەکی خۆشم بردە سەر.
هیاکۆچی

شەو
ڕەنگدانەوەی ڕێگەی شیر ئاسا
لەسەر گوڵە مەرەزە.
ئای زن

مەگرین حەشەرەکان
چوون تەنانەت ئەستێرە عاشقەکانیش
دەردی دووری دەچێژن.
ئایسا

شەوانی شیرینی بەهار
بەبۆنی گوڵە گێلاسەکان
کۆتاییان هات.
باشۆ

**ئەم وەرگێڕانە**

**لە**2007/6/20 **دەستی پێکراوە**

**لە**2007/9/26 **تەواو بووە.**

**لەکۆتاییدا دەکرێ زۆر سوپاسی مامۆستاو هاوڕێم (عەبدولکەریم شێخانی) بکەم کەهەمیشە کۆمەکم دەکات و بەوەرگێڕانەکانمدا دەچێتەوە، هەم وەك زمانی فارسی هەم وەك زمانی کوردی. ئەم وەرگێڕانە بەشێك لەڕەنجی پڕ گەنجی ئەویشی تێدایە.**